# نزاکانی

# پێغەمبەری خوا

صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ

**(أدعية النبي** صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ**)**


شێخی پایەبەرز:

عبدالمحسن بن حمد العباد البدر

-خوای گەورە بیپارێزێت-

وەرگێڕانی:

لزگین عزیز

١- (اللَّهُمَّ أنْتَ رَبِّي لاَ إلَهَ إلاَّ أنْتَ، خَلَقْتَنِي وأنا عَبْدُكَ وأنا عَلى عَهْدِكَ ووَعْدِكَ ما اسْتَطَعْتُ، أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ ما صَنَعْتُ، أبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وأبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلاَّ أنْتَ).(١)

**واته : خودايه تۆ پەروەردگاری منی ، وه هیچ پەرستراوێك نیه بەحەق شایستەی پەرستن بێت جگه له تۆ ، دروستت كردووم و منیش بەندەی تۆم ، خودايه من لەسەر پەیمان و بەڵێنەكەی خۆمم كه به تۆم داوه تا چەند له تواناما بێت ، خودايه پەنات پێ دەگرم له شەڕ و خراپەی ئەو كردەوانەی كه ئەنجامم داوه ، خودايه دان بەوەدا دەنێم كه تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا ڕشتووم ، وه دانیش به تاوانەكانم دا دەنێم وه داوای لێ خۆشبوونت لێ دەكەم ، چونكه بێگومان هیچ كەسێكیش له تاوانەكان خۆش نابێت جگه له تۆ .**

٢- (اللَّهُمَّ إنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، ولاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلّا أنْتَ، فاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِن عِنْدِكَ، وارْحَمْنِي إنَّكَ أنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ). (٢)

**واته : خودايه من ستەمم له نەفسی خۆم كردووه ستەمێكی زۆر ، وه هیچ كەسێكیش له تاوانەكان خۆش نابێت جگه له تۆ ، بۆيه داوات لێ دەكەم لێم خۆش ببیت لێخۆش بوونێك لەلای خۆت وه ڕەحمم پێ بكه ، چونكه به دڵنیایی تۆ زۆر لێخۆش بوو و به بەزەیی .**

---

(1) رواه البخاري (٦٣٠٦) عن شداد بن أوس رضي الله عنه وقد وصف النبي صلى الله عليه و سلم هذا الدعاء بأنه سيد الاستغفار .

(2) رواه البخاري (٨٣٤) و مسلم (٦٨٦٩) عن أبي بكر رضي الله عنه .

٣- (رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وجَهْلِي، وإسْرافِي فِي أمْرِي كُلِّهِ، وما أنْتَ أعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطاياَ وعَمْدِي وجَهْلِي وهَزْلِي، وكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ما قَدَّمْتُ وما أخَّرْتُ، وما أسْرَرْتُ وما أعْلَنْتُ، أنْتَ المُقَدِّمُ وأنْتَ المُؤَخِّرُ، وأنْتَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ).[١]

**واته : خودایه داوات لیَ دەکەم لە هەڵەکانم خۆش بیت وە لە جەهل و نەزانینم و ئیسراف و زیادە ڕوویم لە هەموو کردەوەکانم ، وە ئەوەی تۆ زاناتری پێی لێم ، خودایه داوات لیَ دەکەم لە هەڵەکانم خۆش بیت لەوەی بە ئەنقەست ئەنجامم داوە وە بە جەهل و نەزانین و بە گاڵتەش ، وە ئەم هەموو هەلآنەشم هەیە ، خودایه داوات لیَ دەکەم لەو هەلآنەم خۆش بیت کە پێشم خستوون و ئەوانەش کە دوام خستوون ، وە ئەو هەلآنەم کە بە نهێنی ئەنجامم داون و ئەوانەش کە بە ئاشکرا ئەنجامم داون ، خودایه تۆ پێشخەر و پێشهێنەری وە دوا خەری گشت ڕووداو و پێشهاتەکانی ، وە تۆ توانا و دەستەلآتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .**

٤- (اللهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّهُ، وجِلَّهُ، وأوَّلَهُ وآخِرَهُ وعَلانِيَتَهُ وسِرَّهُ).[٢]

**واته : خودایه داوات لیَ دەکەم لە هەموو تاوانەکانم خۆشبیت ، بچووکی و گەورەی ، وە سەرەتا و کۆتاییەکەی ، وە ئاشکرا و نهێنیەکەی .**

---

( 1 ) رواه البخاري (٦٣٩٨) و مسلم (٦٩٠١) عن أبي موسى رضي الله عنه .

( 2 ) رواه مسلم (١٠٨٤) عن أبي هريرة رضي الله عنه .

٥-    (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ والحَزَنِ، والعَجْزِ والكَسَلِ، والجُبْنِ والبُخْلِ، وضَلَعِ الدَّيْنِ، وغَلَبَةِ الرِّجالِ). [١]

**واته : خودايه من پەنات پێ دەگرم لە خەم و بێ تاقەتی و بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆكی و زۆری قەرزداری و زاڵبوون و دەستەلأتی كەسانی نەزان و نەفام .**

٦-    (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ البُخْلِ، وأعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وأعُوذُ بِكَ أنْ أُرَدَّ إلى أرْذَلِ العُمُرِ، وأعُوذُ بِكَ مِن فِتْنَةِ الدُّنْيا، وأعُوذُ بِكَ مِن عَذابِ القَبْرِ). [٢]

**واته : خودايه من پەنات پێ دەگرم لە ڕەزیلی ، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆكی ، وە پەنات پێ دەگرم لە گەیشتن بەو پەڕی تەمەن و پیری ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی دونیا ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ .**

---

( 1 ) رواه البخاري (٦٣٦٩) عن أنس رضي الله عنه .

( 2 )رواه البخاري (٦٣٦٥) عن سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه .

٧- (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ والهَرَمِ، والمَأْثَمِ والمَغْرَمِ، ومِن فِتْنَةِ القَبْرِ، وعَذابِ القَبْرِ، ومِن فِتْنَةِ النّارِ وعَذابِ النّارِ، ومِن شَرِّ فِتْنَةِ الغِنى، وأعُوذُ بِكَ مِن فِتْنَةِ الفَقْرِ، وأعُوذُ بِكَ مِن فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ عَنِّي خَطايايَ بِماءِ الثَّلْجِ والبَرَدِ، ونَقِّ قَلْبِي مِنَ الخَطايا كَما نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وباعِدْ بَيْنِي وبَيْنَ خَطايايَ كَما باعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ والمَغْرِبِ). [١]

**واته : خودایە پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و گەیشتن بەو پەڕی تەمەن و پیری و تاوان و قەرزداری ، وە لە فیتنەی ناو گۆڕ و سزای ناو گۆڕ ، وە لە فیتنەی ئاگر و سزای ئاگر ، وە لە شەڕی فیتنەی دەوڵەمەندی ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی هەژاری ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەجال ، خودایە داوات لێ دەکەم هەڵەکانم پاك بکەیتەوە و بیان شوریت بە ئاوی بەفر و تەرزە ، وە دڵم لە هەڵە و تاوانەکان پاك بکەرەوە هەر وەك چۆن جلی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەکەیتەوە ، وە نێوان خۆم و هەڵە و تاوانەکانم دوور بخەرەوە ، هەر وەك چۆن نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوات دوور خستووتەوە .**

( 1 )رواه البخاري (٦٣٦٨) و مسلم (٦٨٧١) عن عائشة رضي الله عنها .

٨- (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَواتِ، ورَبَّ الأَرْضِ، ورَبَّ العَرْشِ العَظِيمِ ، رَبَّنا ورَبَّ كُلِّ شَيءٍ، فالِقَ الحَبِّ والنَّوى، ومُنْزِلَ التَّوْراةِ والإِنْجِيلِ والفُرْقانِ ، أَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذ بِناصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ، فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وأَنْتَ الظّاهِرُ، فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وأَنْتَ الباطِنُ، فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنّا الدَّيْنَ ، وأَغْنِنا مِنَ الفَقْرِ). [١]

**واته: خودايه پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و زەوی ، پەروەردگاری عەرشی گەورە ، پەروەردگارمان و پەروەردگاری هەموو شتێك ، ئەی ئەو زاتەی کە دانەوێڵەکان دوو لەت دەکەيت – و ڕووەکيان لێوە بەرهەم دەهێنيت - و دابەزێنەری تەوڕات و ئينجيل و فورقان – قورئان- ، پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و زيانی هەموو ئەو دروستکراوانەی خۆت ، خودايە هەر تۆ سەرەتا و يەکەم بوويتە و پێش تۆ هيچ کەس و شتێك نەبووە ، وە هەر تۆ کۆتايی و دواهەمينيت و بەتەنها دەمێنيتەوە دوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان ، وە هەر تۆ بالاّ دەستيت بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا ، وە هەر تۆ زانايت بە نهێنيەکان و هيچ شتێك نيە کە نهێنی بێت و تۆ نەيبينيت يان نەيبينيت ياخۆد زانياريت پێی نەبێت و ئاگاداری نەبيت ، سا خودايە قەرزداريمان لەسەر لابەرە و دەوڵەمەنديشمان بکە لە هەژاری .**

( 1 )رواه مسلم (٦٨٨٩) عن أبي هريرة رضي الله عنه .

٩- (اللَّهمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ ما عَمِلْتُ، ومِن شَرِّ ما لَمْ أعْمَلْ). [١]

**واته : خودايه من پەنات پێ دەگرم له شەڕ و زيانى ئەو تاوانانەى كه له ڕابردوو ئه نجامم داون ، وه له شەڕ و زيانى ئەو تاوانانەى كه ئه نجامم نەداون .**

١٠- (اللَّهُمَّ أصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أمْرِي، وأصْلِحْ لِي دُنْيايَ الَّتِي فِيها مَعاشِي، وأصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيها مَعادِي، واجْعَل الحَياةَ زِيادَةً لِي فِي كُل خَيْرٍ، واجْعَل المَوْتَ راحَةً لِي مِن كُل شَرٍّ). [٢]

**واته : خودايه داوات لێ دەكەم دينەكەم بۆ چاك بكەيت كه به هۆيەوه پارێزراو دەبم له دونيا و قيامەت ، وه دونيام بۆ چاك بكەيت كه ژيانى منى تێدايه ، وه ئاخيرەت و دوا ڕۆژم بۆ چاك بكەيت كه گەڕانەوەم هەر بۆ ئەوێ يه ، وه ژيانم بۆ بكه زياد كردنى هەموو چاكه و خێرێك ، وه مردنم بۆ بكه به حەسانەوه و دوور بوون له هەموو شەڕ و زيانێك و فيتنەيەك .**

١١- (اللَّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ الهُدى والتُّقى والعَفافَ والغِنى). [٣]

**واته : خودايه من داواى هيدايەت و پارێزراوى و تەقوا و پاكى و دوور بوون له هەموو جۆره پيسييێك و بێ پێويست بوون له خەڵكى له تۆ دەكەم .**

---

( 1) رواه مسلم (٦٨٩٥) عن عائشة رضي الله عنها

( 2) رواه مسلم (٦٩٠٣) عن أبي هريرة رضي الله عنه .

( 3) رواه مسلم (٦٩٠٤) عن ابن مسعود رضي الله عنه .

١٢-  (اللَّهمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ العَجْزِ والكَسَلِ، والجُبْنِ والبُخْل، والهَرَمِ وعَذابِ القَبْرِ، اللَّهمَّ آتِ نَفْسِي تَقْواها، وزَكِّها أنْتَ خَيْرُ مَن زَكّاها، أنْتَ ولِيُّها ومَوْلاَها اللَّهمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ ومِن قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، ومِن نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، ومِن دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجابُ لَهَا). [١]

**واته : خودایه من پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەمبەڵی ، وە لە ترسنۆکی و ڕەزیلی ، وە گەیشتن بەو پەڕی تەمەن و پیری و سزای ناو گۆڕ ، خودایە داوات لێ دەکەم تەقوا بە نەفسم ببەخشیت ، وە نەفسم پاك بکەرەوە لە هەموو ڕەوشتێکی خراپ چونکە بە دڵنیایی تۆ چاکترین کەسی کە نەفسم پاك بکەیتەوە ، هەر تۆ خوا و پەروەردگاری ئەو نەفسەی ، خودایە من پەنات پێ دەگرم لە زانستێك کە سودی نەبێت بۆم [واتە : کاری پێ نەکەم ، کردەوەی پێ ئەنجام نەدەم] ، وە پەنات پێ دەگرم لە دڵێك کە ترسی تیادا نەبێت و لێت نەترسێت ، وە پەنات پێ دەگرم لە نەفسێك کە تێر نەبێت لەوەی کە پێت بەخشیووە ، وە پەنات پێ دەگرم لە نزایێك کە وەڵام نەدرێتەوە .**

( 1 ) رواه مسلم (٦٩٠٦) عن زيد بن أرقم رضي الله عنه .

١٣- (اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وبِكَ آمَنتُ، وعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وبِكَ خاصَمْتُ، أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ، لا إِلَهَ إلا أَنْتَ، أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الحَيُّ الَّذِي لا تَمُوتُ، والجِنُّ والإِنْسُ يَمُوتُونَ). (١)

**واتە : خودایە من تەنها تەسلیمی تۆ بووم ، وە تەنها ئیمانم بە تۆ هێنا ، وە تەنها پشتم بە تۆ بەست لە کردەوەکانم و کارەکانم ، وە بۆ لای تۆ گەڕامەوە بە هیممەتەوە ، وە بەو بەڵگانەی تۆ پێت بەخشیوم بەرەنگاری دوژمنانی دینەکەت دەبمەوە ، خودایە من پەنا دەگرم بە هێزی دەسەلاتی تۆ ، هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ کەوا گومڕام بکەیت ، تۆ ئەو زیندووەی کە نامریت و جنوکە و مرۆڤەکان هەر هەموویان دەمرن .**

١٤- (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن زَوالِ نِعْمَتِكَ، وتَحْوِيلِ عافِيَتِكَ، وفُجاءَةِ نَقْمَتِكَ، وجَمِيعِ سُخْطِكَ). (٢)

**واتە : خودایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕۆیشتن و نەمانی ئەو نیعمەت و بەخششەی تۆ پێت بەخشیووم ، وە لە ڕۆیشتن و نەمانی عافیەت و لەش ساغی کە تۆ پێت بەخشیووم ، وە لە سزای لە ناکاوی تۆ ، وە لە هەموو ئەو شتانەی هۆکارن بۆ تۆڕە بوونی تۆ .**

( 1 ) رواه البخاري (٧٣٨٣) مسلم (٦٨٩٩) عن ابن عباس رضي الله عنهما .

( 2 ) رواه مسلم (٦٩٤٣) عن ابن عمر رضي الله عنهما .

١٥-  (اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ القُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلى طاعَتِكَ). [١]

**واته: ئەی ئەو خودایەی کەوا گۆڕانکاری لە دڵەکان دەکەیت ، دڵەکانمان بگۆڕە و ئاراستە بکە بۆ سەر تاعەت و گوێڕایەڵی خۆت .**

١٦-  (اللَّهُمَّ رَبَّ جَبْرائِيلَ ومِيكائِيلَ وإسْرافِيلَ، فاطِرَ السَّماواتِ والأرْضِ، عالِمَ الغَيْبِ والشَّهادَةِ، أنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبادِكَ فِيما كانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِما اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الحَقِّ بِإذْنِكَ، إنَّكَ تَهْدِي مَن تَشاءُ إلى صِراطٍ مُسْتَقِيمٍ). [٢]

**واته: خودایە ئەی پەروەردگاری جبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل ، بە دیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ، زانای غەیب و ئاشکرا ، تۆ حوکم دەکەیت لە نێوان بەندەکانت دا لەو شتەدا کە جیاوازن تیایدا ، سا ڕێنمویم بکە بۆ ئەو حەقەی کە خەڵکی تیایدا جیاوازن بە ئیزنی خۆت ، بەڕاستی تۆ ڕێنمویی هەر کەسێك بتەوێ دەیکەیت بۆ سەر ڕێگای ڕاست .**

( 1 ) رواه مسلم (٦٧٥٠) عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما .

( 2 ) رواه مسلم (١٨١١) عن عائشة رضي الله عنها .

١٧-  (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِرِضاكَ مِن سَخَطِكَ، وبِمُعافاتِكَ مِن عُقُوبَتِكَ، وأعُوذُ بِكَ مِنكَ، لا أُحْصِي ثَناءً عَلَيْكَ، أنْتَ كَما أثْنَيْتَ علَى نَفْسِكَ). [١]

**واتە: خودایە پەنا دەگرم بە ڕازیبوونت لە توڕەیت ، وە پەنا دەگرم بە لێ بووردەیت لە سزادانت ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە سزا و توڕەییت ، ناتوانم ستایشت بژمێرم ، تۆ بەو جۆرەی کە خۆت ستایشی خۆت کردووە .**

١٨-  (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن جَهْدِ البَلاءِ، ودَرَكِ الشَّقاءِ، وسُوءِ القَضاءِ، وشَماتَةِ الأعْداءِ). [٢]

**واتە: خودایە من پەنات پێ دەگرم لە سەختی و مەشەقەت ، وە لە گەیشتن بەو شتانەی کە هۆکاری بەهیلاك چوونن ، وە لە قەزا و قەدەری ناخۆش و ئازار بەخش ، وە لە دڵخۆش بوونی دوژمنان بەهۆی بەلایەك کە بە سەرم دێت .**

( 1) رواه مسلم (١٠٩٠) عن عائشة رضي الله عنها .

( 2) رواه البخاري (٦٣٤٧) و مسلم (٦٨٧٧) عن أبي هريرة رضي الله عنه و لفظه (( كان رسول الله صلى الله عليه و سلم يتعوذ من ...))

١٩- (اللَّهُمَّ اجْعَلْ لِي فِي قَلْبِي نُورًا، وفِي لِسانِي نُورًا، وفِي سَمْعِي نُورًا، وفِي بَصَرِي نُورًا، ومِن فَوْقِي نُورًا ، ومِن تَحْتِي نُورًا ، وعَنْ يَمِينِي نُورًا ، وعَنْ شِمالِي نُورًا، ومِن بَيْنِ يَدَيَّ نُورًا ، ومِن خَلْفِي نُورًا ، واجْعَلْ فِي نَفْسِي نُورًا ، وأَعْظِمْ لِي نُورًا). (١)

**واته : خودایه ڕۆناکی له دڵمدا بەرپا بکه ، و له زار و بیستن و بینین و سەرەوە و خوارەوە و لای ڕاست و لای چەپ و پێشەوە و دواوە و له دەروونمدا ڕۆناکی بچەسپێنه ، وە ڕۆناکییێکی گەورەم پێ ببەخشه .**

٢٠- (اللَّهُمَّ إنِّي أسْأَلُكَ مِنَ الخَيْرِ كُلِّهِ عاجِلِهِ وآجِلِهِ، ما عَلِمْتُ مِنهُ وما لَمْ أعْلَمْ، وأعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ عاجِلِهِ وآجِلِهِ، ما عَلِمْتُ مِنهُ وما لَمْ أعْلَمْ، اللَّهُمَّ إنِّي أسْأَلُكَ مِن خَيْرِ ما سَأَلَكَ عَبْدُكَ ونَبِيُّكَ، وأعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ ما عاذَ بِهِ عَبْدُكَ ونَبِيُّكَ، اللَّهُمَّ إنِّي أسْأَلُكَ الجَنَّةَ وما قَرَّبَ إلَيْها مِن قَوْلٍ أوْ عَمَلٍ، وأعُوذُ بِكَ مِنَ النّارِ وما قَرَّبَ إلَيْها مِن قَوْلٍ أوْ عَمَلٍ،وأسْأَلُكَ أنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْرًا). (٢)

**واته : خودایه من داوای خێر و چاکەت لێ دەکەم هەر هەمووی له دونیا و قیامەت ئەوەی من زانیومه و ئەوەی نەم زانیوه ، وە پەنات پێ دەگرم له شەڕ و زیان هەر هەمووی له دونیا و قیامەت ئەوەی من زانیومه و ئەوەی نەم زانیوه ، خودایه من داوای ئەو خێر و چاکەت لێ دەکەم**

---

( 1 ) رواه البخاري (٦٣١٦) و مسلم (١٧٩٧) عن ابن عباس رضي الله عنه .

( 2 ) رواه ابن ماجه (٣٨٤٦) بإسناد صحيح عن عائشة ، انظر (( السلسلة الصحيحة)) للألباني (١٥٤٢ )

**كە بەندەكەت و پێغەمبەرەكەت داوای لێت كردووە ، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و زیانی ئەوەی كە بەندەكەت و پێغەمبەرەكەت پەنای پێت گرتووە ، خودایە من داوای بەهەشتت لێ دەكەم وە هەر هۆكارێك كە دەبێتە هۆی نزیك كردنەوە لێی لە قسە و كردەوە ، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاگر و هەر هۆكارێك كە دەبێتە هۆی نزیك كردنەوە لێی لە قسە و كردەوە ، وە داوات لێ دەكەم هەر قەزا و قەدەرێكت بۆ نووسیوم بیكەیتە خێر و چاكە بۆم .**

٢١- (اللَّهُمَّ بِعِلْمِكَ الغَيْبَ، وقُدْرَتِكَ عَلَى الخَلْقِ، أَحْيِنِي ما عَلِمْتَ الحَياةَ خَيْرًا لِي، وتَوَفَّنِي إذا عَلِمْتَ الوَفاةَ خَيْرًا لِي، اللَّهُمَّ وأَسْأَلُكَ خَشْيَتَكَ فِي الغَيْبِ والشَّهادَةِ، وأَسْأَلُكَ كَلِمَةَ الحَقِّ فِي الرِّضا والغَضَبِ، وأَسْأَلُكَ القَصْدَ فِي الفَقْرِ والغِنى، وأَسْأَلُكَ نَعِيمًا لا يَنْفَدُ، وأَسْأَلُكَ قُرَّةَ عَيْنٍ لا تَنْقَطِعُ، وأَسْأَلُكَ الرِّضاءَ بَعْدَ القَضاءِ، وأَسْأَلُكَ بَرْدَ العَيْشِ بَعْدَ المَوْتِ، وأَسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إلى وجْهِكَ، والشَّوْقَ إلى لِقائِكَ فِي غَيْرِ ضَرّاءَ مُضِرَّةٍ، ولا فِتْنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللَّهُمَّ زَيِّنّا بِزِينَةِ الإيمانِ، واجْعَلْنا هُداةً مُهْتَدِينَ). [١]

**واتە : خودایە بە زانستی غەیبی خۆت و هێز و توانات بەسەر دروستكراوەكاندا بمژیێنە تا ئەو كاتەی دەزانیت ژیان چاكترە بۆم ، وە بم مرێنە گەر زانیت مردن چاكترە بۆم ، وە خودایە داوات لێ دەكەم وام لێ بكەیت كە ترسم لە سزای تۆ هەبێت لە پەنهانی و ئاشكراییدا ، وە داوات لێ دەكەم ووشەی حەقم پێ ببەخشیت لە كاتی ڕەزامەندی و تووڕەییدا [كەوا حەق و**

---

( 1 ) رواه النَّسائي (١٣٠٥) بإسناد حسن عن عمار بن ياسر رضي الله عنه .

**ڕاستی مەبەستم بێت لە هەموو بارودۆخێکدا ]، وە داوای ئەوەت لێ دەکەم کەوا لە کاتی دەوڵەمەندی و هەژاریدا من هەر مام ناوەند بم [واتە : لە کاتی دەوڵەمەندیدا ئیسراف و زیادە ڕوویی نەکەم ، وە لە کاتی هەژاریشدا دڵ تەنگ نەبم و ترسی ڕزق و روزیم نەبێت] ، وە داوای خۆشی و نیعمەتێکت لێ دەکەم کە کۆتایی نەیەت [کە ئەوەش خۆشی ئاخیرەت و دوا ڕۆژ و بەهەشتە] ، وە داوای دڵخۆشییێکت لێ دەکەم کە نەبڕاوە بێت** [قرة عين : **کۆکراوەی هەموو خۆشیەکانە لە دونیا و قیامەت] ، وە داوات لێ دەکەم کەوا ڕازی بوونم پێ ببەخشی لە دوای قەزا و قەدەری تۆ لە خۆشی و ناخۆشی ، وە داوای حەسانەوە و ئارامیت لێ دەکەم لە دوای مردن ، وە داوای تام و چێژی سەیرکردن و بینینی ڕۆخساری خۆت لێ دەکەم ، وە داوای ئارەزووکردنی بینین و دیداری تۆ دەکەم بە شێوەیەك کە ئەو ئارەزوو کردنە هیچ شتێکی وای تیادا نەبێت کە تۆشی ئازاردانم بکات و فیتنەی گومڕا کەری تیادا نەبێت ، خودایە جوانمان بکە و بمان ڕازێنەوە بەجوانی ئیمان [واتە : ناخمان و ڕوکەشمان] ، وە خودایە لەو کەسانەمان بکە کە خۆیان هیدایەت دراون و خەڵکیش هیدایەت دەدەن .**

٢٢- (اللَّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَفْوَ والعافِيَةَ فِي الدُّنْيا والآخِرَة، اللَّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَفْوَ والعافِيَةَ فِي دِينِي ودُنْيايَ وأهْلِي ومالِي، اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْراتِي وآمِن رَوْعاتِي، واحْفَظْنِي مِن بَيْنِ يَدَيَّ ومِن خَلْفِي، وعَنْ يَمِينِي وعَنْ شِمالِي، ومِن فَوْقِي، وأعُوذُ بِكَ أنْ أُغْتالَ مِن تَحْتِي).[١]

**واته : خودایه من داوای لێ خۆشبوون و پارێزراویت لێ دەکەم له دونیا و دوا ڕۆژدا ، خودایه من داوای لێ خۆشبوون و پارێزراویت لێ دەکەم له ئاین و دونیا و خانەوادە و سامانمدا ، خودایه عەیب و ناتەواوی و کەم و کورتیەکانم داپۆشه ، خودایه ترس و دڵه ڕاوکێم مەهێڵه ، خودایه له پێش و پاش و ڕاست و چەپم و سەروومەوە پارێزراوم بکه، خودایه پەنا دەگرم به گەورەییت لەوەی که له ژێرمەوە سزا بدرێم .**

٢٣- (اللَّهُمَّ عالِمَ الغَيْبِ والشَّهادَةِ فاطِرَ السَّمَواتِ والأرْضِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ ومَلِيكَهُ أشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلّا أنْتَ أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ نَفْسِي ومِن شَرِّ الشَّيْطانِ وشِرْكِهِ).[٢]

**واته : خودایه ئەی زانا به شته پەنهانی و ئاشکراکان ، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ، ئەی پەروەردگار و پادشای هەموو شتێك ، شایەتی دەدەم بەوەی که هیچ پەرستراوێك نیه به حەق شایستەی پەرستن بێت جگه له تۆ ، خودایه پەنا دەگرم به تۆ له خراپەی نەفس و دەروونم ، هەروەها له خراپەی شەڕی شەیتان و ئەو شتەش که بانگەشەی بۆ دەکات .**

---

( 1) رواه أبو داود (٥٠٧٤) و غيره بإسناد صحيح عن ابن عمر رضي الله عنهما .

( 2) رواه الترمذي (٣٣٩٢) و غيره بإسناد صحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه .

٢٤- (اللَّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ الثَّباتَ فِي الأمْرِ والعَزِيمَةَ عَلى الرُّشْدِ، وأسْألُكَ مُوجِباتِ رَحْمَتِكَ، وعَزائِمَ مَغْفِرَتِكَ ، وأسألُكَ شُكْرَ نِعْمَتِك، وحُسنَ عِبادَتِك، وأسألُك قَلبًا سَليمًا، ولِسانًا صادِقًا، وأسألُك مِن خَيرِ ما تَعلَمُ، وأعُوذُ بِك من شَرِّ ما تَعْلَمُ، وأستغْفِرُكَ لِما تَعْلَمُ ، إنَّكَ أنْتَ عَلّامُ الغُيُوبِ). [1]

**واته : خودایه من داوای بەردەوامی و ئیستیقامەت لێ دەكەم لەسەر ئەم دینه ، وه بەستنەوەی دڵ لەسەرجێ بەجێ كردنی فەرمانەكان ، وه داوای ئەو شتانەت لێ دەكەم كه دەبنه هۆكاری بەدەست هێنانی ڕەحمەت و بەزەیی تۆ ، وه ئەو شتانەی كه دەبنه هۆكاری لێ خۆش بوونت ، وه داوات لێ دەكەم كەوا یارمەتیم بدەیت بۆ سوپاس كردنی نیعمەت و بەخششەكانت ، وه یارمەتیم بدەیت بۆ چاك پەرستنی تۆ ، وه داوات لێ دەكەم كەوا دڵێكی پاك و چاكم پێ ببەخشیت كه پارێزراو بێت له بیروباوەڕه خراپەكان و ئارەزووەكان ، وه زمانێكی ڕاستگوم پێ ببەخشیت ، وه داوای ئەو خێر و چاكەیەت لێ دەكەم كه تۆ دەیزانیت چاكه ، وه پەنات پێ دەگرم له شەڕی ئەو شتەی تۆ دەیزانیت كه شەڕه ، وه داوای لێ خۆشبوونت لێ دەكەم لەوەی كه دەیزانیت ، بەڕاستی و دڵنیایی تۆ زانای شته غەیب و شاراوەكانی .**

(1) رواه الطبراني في (( الكبير)) عن شداد بن أوس بإسناد حسن و انظر (( السلسلة الصَّحيحة)) للألباني (٣٢٢٨) .

٢٥- (اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِواكَ).[١]

**واته : خودايه دوورم بخەرەوە بە ڕۆزییێکی ڕێگە پێدراو و حەڵاڵ ، لەو ڕۆزییەی کە قەدەغەت کردووە و حەڕامە ، وە بێ پێویستیشم بکە بە فەزڵ و گەورەیی خۆت لە کەسانێکی تر جگە لە خۆت .**

٢٦- (اللَّهُمَّ عافِنِي فِي بَدَنِي، اللَّهُمَّ عافِنِي فِي سَمْعِي، اللَّهُمَّ عافِنِي فِي بَصَرِي، لا إِلَهَ إِلّا أَنْتَ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكُفْرِ والفَقْرِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عَذابِ القَبْرِ، لا إِلَهَ إِلّا أَنْتَ).[٢]

**واته : خودايه ساغ و سەلامەتیم پێ ببەخشە لە لاشەمدا ، خودايه ساغ و سەلامەتیم پێ ببەخشە لە بیستنمدا ، خودايه ساغ و سەلامەتیم پێ ببەخشە لە لە بینینمدا ، هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ خودايه من پەنات پێ دەگرم لە بێ باوەڕی و هەژاری ، هەروەها پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ ، هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ .**

( 1) رواه الترمذي (٣٥٦٣) بإسناد حسن عن علي و انظر (( السلسلة الصَّحيحة)) للألباني (٢٦٦) .

( 2) رواه أبو داود (٥٠٩٠) بإسناد حسن عن أبي بكرة .

٢٧- (رَبِّ أعِنِّي ولا تُعِنْ عَلَيَّ وانْصُرْنِي ولا تَنْصُرْ عَلَيَّ وامْكُرْ لِي ولا تَمْكُرْ عَلَيَّ واهْدِنِي ويَسِّرْ الهُدى لِي وانْصُرْنِي عَلى مَن بَغى عَلَيَّ رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكّارًا لَكَ ذَكّارًا لَكَ رَهّابًا لَكَ مِطْواعًا لَكَ مُخْبِتًا إلَيْكَ أوّاهًا مُنِيبًا رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي واغْسِلْ حَوْبَتِي وأجِبْ دَعْوَتِي وثَبِّتْ حُجَّتِي وسَدِّدْ لِسانِي واهْدِ قَلْبِي واسْلُلْ سَخِيمَةَ صَدْرِي). [١]

**واته : خودایه یارمەتیم بدە و یارمەتی هیچ کەسێك مەدە کەوا زەرەر و زیانم پێ بگەیێنێت ، وە سەرم بخە و هیچ کەسێك بەسەرمدا سەر مەخە [زاڵ مەکە] ، وە خودایە نەخشە و پیلانی چاك بۆ من دابنێ و نەخشە و پیلان لە دژم دامەنێ ، وە هیدایەتم بدە و هیدایەتم بۆ ئاسان بکە ، وە سەرم بخە بەسەر ئەوانەی کەوا دەستدرێژی دەکەنە سەرم و زوڵمم لێ دەکەن ، خودایە وام لێ بکە کەوا سوپاس و شوکرانەی تۆ بکەم ، وە زۆر زیاد یادی تۆ بکەم ، وە ترسم لە سزای تۆ هەبێت ، وە فەرمانەکانی تۆ جێ بەجێ بکەم ، وە ترس و زەلیلیم بۆ تۆ هەبێت ، وە بمکەیتە کەسێك کە زۆر دەپاڕێتەوە لێت و دەگرییێت ، وە بمکەیتە کەسێکی گەڕاوە لە تاوان و تەوبەکار ، خودایە تەوبەکەم قبوڵ بکە و تاوانەکانم بشۆ و وەڵامی نزاکانم بدەوە و بەڵگەکانم جێگیر و چەسپاو بکە و زمانم وا لێ بکە کەوا تەنها حەق بڵێت و ڕاستی بپێکێت و خراپە و ئیرەیی و حەسادەت لە دڵم دەربێنە .**

( 1 ) رواه الترمذي (٣٥٥١) و غيره بإسناد صحيح عن ابن عباس رضي الله عنهما .

٢٨- (اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ كُلُّهُ، اللَّهُمَّ لاَ قابِضَ لِما بَسَطْتَ، ولاَ باسِطَ لِما قَبَضْتَ، ولاَ هادِيَ لِمَن أَضْلَلْتَ، ولاَ مُضِلَّ لِمَن هَدَيْتَ، ولاَ مُعْطِيَ لِما مَنَعْتَ، ولاَ مانِعَ لِما أَعْطَيْتَ، ولاَ مُقَرِّبَ لِما باعَدْتَ، ولاَ مُباعِدَ لِما قَرَّبْتَ، اللَّهُمَّ ابْسُطْ عَلَيْنا مِن بَرَكاتِكَ، ورَحْمَتِكَ، وفَضْلِكَ، ورِزْقِكَ، اللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ المُقِيمَ الَّذِي لاَ يَحُولُ ولاَ يَزُولُ، اللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ يَوْمَ العَيْلَةِ، والأَمْنَ يَوْمَ الخَوْفِ، اللَّهُمَّ إنِّي عائِذٌ بِكَ مِن شَرِّ ما أَعْطَيْتَنا وشَرِّ ما مَنَعْتَنا، اللَّهُمَّ حَبِّبْ إلَيْنا الإيمانَ وزَيِّنْهُ فِي قُلُوبِنا، وكَرِّهْ إلَيْنا الكُفْرَ والفُسُوقَ والعِصْيانَ، واجْعَلْنا مِنَ الرّاشِدِينَ، اللَّهُمَّ تَوَفَّنا مُسْلِمِينَ، وأَحْيِنا مُسْلِمِينَ، وأَلْحِقْنا بِالصّالِحِينَ غَيْرَ خَزايا ولاَ مَفْتُونِينَ، اللَّهُمَّ قاتِلِ الكَفَرَةَ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ، ويَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، واجْعَلْ عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وعَذابَكَ ، اللَّهُمَّ قاتِلْ كَفَرَةَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتابَ ، إلَهَ الحَقِّ). [(١)]

**واته: خودایه هەموو سەنا و ستایشەکان تەنها شایستەی تۆیە ، خودایه هیچ کەسێك ناتوانێت ئەو شتەمان لەسەر تەسك بکاتەوە و کەمی بکاتەوە کە تۆ لەسەر ئێمەت فراوان کردووە و زۆرت کردووە ، وە هیچ کەسێکیش ناتوانێت ئەو شتەمان لەسەر بەرفراوان بکات کە تۆ لەسەر ئێمەت تەسك کردووتەوە ، وە ئەو کەسەی تۆ گومڕات کردووە هیچ کەسێك ناتوانێت هیدایەتی بدات و ئەو کەسەش کە تۆ هیدایەتت داوە هیچ کەسێك ناتوانێت گومڕای بکات ، وە هیچ کەسێك ناتوانێت ئەو شتە ببەخشێت کە تۆ ڕێگریت لێ کردووە ، وە هیچ**

---

( 1 ) رواه الإمام أحمد (١٥٤٩٢) عن رفاعة الزرقي بإسناد صحيح .

کەسێکیش ناتوانێت ڕێگری لەو شتە بکات کە بەخشیووتە [لە زانست و رزق و ڕۆزی و سەروەت و سامان و پلە بەرزی ...] ، وە هیچ نزیککەرەوەیەك نیە بۆ ئەو شتەی تۆ دوورت خستووتەوە ، وە هیچ دوور خەرەوەیەك نیە بۆ ئەو شتەی تۆ نزیکت کردووتەوە ، خودایە بەرەکەت و ڕەحمەت و بەزەیی و فەزڵ و چاکە و رزق و ڕۆزی خۆت بەسەرماندا بڕێژە و ئاسانی بکە بۆمان و بەردەوامی بکە ، خودایە من داوای ناز و نیعمەتە بەردەوام و نەبڕاوەکانت لێ دەکەم کە گوڕانکارییان بەسەردا نەێت [کە ئەویش ناز و نیعمەتی دوا ڕۆژ و ئاخیرەتە] ، خودایە من داوات لێ دەکەم کە ناز و نیعمەتم بەسەردا برێژیت لە قورسترین ڕۆژی هەژاری و بێ پێویستم بکەیت لە داواکردن لە خەڵکی ، وە خودایە داوای پارێزراویت لێ دەکەم لەو ڕۆژەی کە ترس بەرپا دەبێت ، خودایە من پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و زیانی ئەو شتەی کە پێت بەخشیووم [لە رزق و ڕۆزی و سەروەت و سامان کە مافیان نەدەم لە زەکات دا و بەخشن یاخۆد بەهۆیەوە سیلەی ڕەحمم بپچڕێنم یاخۆد خراپ بە کاری بهێنم لە تاوان و سەرپێچی تۆ دا] ، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و زیانی ئەو شتەی کە پێت نەبەخشیووم [وەك حەسودی بردن بە کەسانێك کە خوا ناز و نیعمەتی پێ بەخشیوون ، و هەوڵدان بۆ لەناو بردنی ئەو نیعمەتانەی کە خوا بەو کەسانەی بەخشیووە ...] ، خودایە ئیمان لە دڵەکانماندا خۆشەویست بکە و لە دڵەکانماندا بیڕازێنەوە ، وە کوفر و فاسقی و تاوان و سەرپێچی و یاخی بوون لە دڵەکانماندا بێزێنراو بکە ، وە خودایە لەو کەسانەمان بکە کە لەسەر ڕێگای ڕاستن ، خودایە لەسەر ئیسلام بمان مرێنە ، وە لەسەر ئیسلام بمان ژیێنە ، وە بمان گەیێنە پیاو چاك و صالحەکان ، خودایە زەلیل و سەر شوڕمان مەکە بە ئەنجام دانی تاوان و سەرپێچی فەرمانی تۆ ، وە تۆشی فیتنەشمان مەکە ، خودایە بێ بڕوا وکافرەکان لەناو ببە ئەو کافرانەی کە پێغەمبەرەکانی تۆ بە درۆ دەخەنەوە و ڕێگری دەکەن لە بڵاوبوونەوەی ئاینەکەی تۆ ، وە سزا

**و تۆڕەیی خۆت دابەزێنە سەریان ، خودایە بیْ بڕوا و كافرەكان لەناو ببە ئەو كافرانەی كە ئەهلی كیتابن ، ئەی پەروەردگاری حەق ، آمین [واتە : خودایە ئەم نزایە گیرا بكە ].**

٢٩- (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّدٍ وعَلى آلِ مُحَمَّدٍ كَما صَلَّيْتَ عَلى إبْراهِيمَ وآلِ إبْراهِيمَ؛ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وبارِكْ عَلى مُحَمَّدٍ وعَلى آلِ مُحَمَّدٍ كَما بارَكْتَ عَلى إبْراهِيمَ وآلِ إبْراهِيمَ؛ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ). [1]

**واتە: خودایە دروود و ڕەحمەت و بەزەیی بڕێژە بۆ سەر محمد ، وە خزم و كەسانی شوێنكەوتووی و هاوەڵانی و ئوممەتەكەی ، هەر وەك چۆن دروود و ڕەحمەت و بەزەیت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و كەسانی شوێنكەوتووی و هاوەڵانی و ئوممەتەكەی ، بێگومان تۆ سوپاسكراو و خاوەن شكۆ و ڕێزیت ، خودایە پیْز و بەرەكەت بڕێژە بۆ سەر محمد ، وە خزم و كەسانی شوێنكەوتووی و هاوەڵانی و ئوممەتەكەی ، هەر وەك چۆن پیْز و بەرەكەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و كەسانی شوێنكەوتووی و هاوەڵانی و ئوممەتەكەی ، بێگومان تۆ سوپاسكراو و خاوەن شكۆ و ڕێزیت .**

( 1 ) رواه البخاري (٣٣٧٠) و مسلم (٩٠٨) عن كعب بن عُجرة رضي الله عنه .